زانایانی کورد لەبەر هەر هۆکارێک بووبێت؛ بەشێکیان لە کوردستان دەرچوون و لە دەڤەر و وڵاتی تر نیشتەجێ بوون. بەتایبەتی لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا بەشی زۆری خاکی مسوڵمانان لەبەر دەستی عوسمانییەکاندا بووە و بەوهۆیەوە زانای کورد وەک زانایانی نەتەوەکانی تر لە کوێ ویستبێتیان بژین لەوێ نیشتەجێ بوون. بەهۆی کاری دەوڵەتیشەوە زانای کورد ناچار بووە وڵاتی خۆی بەجێبهێڵێت و لە شوێنی کارەکەی بمێنێتەوە، ئەمەش بۆ موفتی، قازیی و دادوەر و فەرمانبەرانی ئاسایی کارێکی سرووشتی بووە. لەگەڵ ئەوەشدا سێ شوێن زۆرترین زانای کوردی لەباوەش گرتووە، ئەوانیش بەغدا، ئەستەنبوڵ و حیجاز بوون. یەکەمیان وەک شوێنێکی نزیک لە جوگرافیای وڵاتی کوردان بووە و بە درێژایی چەندین سەدە زانای کوردی لێبوون، دووەمیان وەک ناوەندی دەسەڵاتی عوسمانی بەشێک لە زانا و کەسایەتییە کوردەکانی بەهۆکاری جیاجیا لەخۆگرتووە. سێیەمینیشیان هەردوو شاری مەککە و مەدینە لەبەر پیرۆزییەکەیان هەر لە کۆنەوە زانایانی کورد هەڵوەدابوون لەوێ بمێننەوە. لەوبارەشەوە دەیان زانای کورد هەن وێڕای ئەوەی پایەیەکی گەورەی کارگێڕیی و زانستییان لەو دوو شارەدا هەبووە، لەهەمانکاتیشدا هەبوون کە موجاویری ئەو دوو شارە بوون و تا کۆتایی ژیانیان لەوێ سەریان ناوەتەوە.

لەنێو زانایانی کورددا ماڵباتی بەرزنجەییەکان دیارترین بنەماڵەن کە بەدرێژایی سێسەد ساڵ لەو دوو شارە ماونەتەوە، بەتایبەتیش لە شاری مەدینە پایەی گرنگیی میرییان هەبووە. دیارترینی ئەم بنەماڵەیە جەعفەر بەرزنجی بووە. ئەگەرچی ئەمەی ئێستا باسی دەکەین جەعفەر بەرزنجیی دووەمە و سەدە و نیوێک پێشتر جەعفەر بەرزنجییەکی تریش هەبووە. مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس چەند دێڕێکی کورتی لەبارەوە نووسیوە: جەعفەر کوڕی ئیسماعیل کوڕی زەینەلعابیدین کوڕی محەمەد بەرزنجییە. لە ئەزهەر خوێندوویەتی سەرپەرشتی فەرمانگەی فتوای مەدینەی کردووە و کۆمەڵێک بەرهەمی نووسیوە.[١] وادیارە بەگوێرەی بۆچوونی (الزركلي) ناوبراو لە سلێمانی (یان وردتر لە بەرزنجە) لەدایکبووە[٢] و

١ علماؤنا في خدمة العلم والدين، عبدالكريم محمد المدرس، ص١٣٦.

٢ خيرالدين الزركلي، الأعلام، قاموس تراجم لأشهر الرجال والنساء من العرب والمستغربين والمستشرقين، ج٢، دار العلم للملايين، بيروت، ط١٥، ٢٠٠٢، ص٢٢١.

بۆ خوێندن چووەتە ئەزهەر و دواتر چووەتە مەدینە.

لەنێو بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا بەڵگەنامەگەلێک لەبارەی ئەم زانایەمان دەبینرێت، لەبەر ڕۆشنایی ئەو بەڵگەنامانە دەتوانین چەند لایەنێکی ژیانی بۆ یەکەم جار ئاشکرا بکەین.

## جەعفەر بەرزنجی و موفتییاتی:


i.ŞD.84/4976

İ.ŞD.00084

بەداخەوە شتێکی ئەوتۆ لەبارەی منداڵیی و سەردەمی گەنجیی جەعفەر بەرزنجی لەنێو بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا نابینرێت، ئەوەندە هەیە ئاماژە بەوە دراوە کە ئەو کوڕی ئیسماعیل بەرزنجییە، کە ئەویش سەردەمێک موفتیی شافیعییەکانی مەدینە بووە.(نازانرێ ئایا ئەگەر جەعفەر بەرزنجی ڕاست بێ کە لە سلێمانی لەدایک بووبێ؛ ئایا دواتر باوکی هاتووە و بۆتە موفتیی مەدینە، یان هەر لە مەدینە لەدایکبووە و باوکیی لەو بنەماڵانەی ئەوێ بووە؟ ئێمە وای بۆ دەچین کە (الزركلی) هەڵەی کردبێت و ڕاستییەکەی ئەوە بێت کە جەعفەر بەرزنجی لە مەدینە لەدایکبووە). ئەم بابەتە پێویستی بە توێژینەوەی وردتر هەیە.

لە بەڵگەنامەیەکدا کە مێژووی ١٢٧٨/٦/٩ی کۆچی لەسەر نووسراوە، ئاماژە بەوە دراوە لەبەر ئەوەی ئیسماعیل ئەفەندیی بەرزنجی؛ موفتیی شافیعییەکانی مەدینە نەخۆشە، بەوهۆیەوە جەعفەر ئەفەندی کوڕی لە شوێنی دادەمەزرێت.[٣] هەر بەهۆی بەڵگەنامەیەکەوە بۆمان ئاشکرا دەبێت کە جەعفەر بەرزنجی لە ساڵی ١٢٧٩ی کۆچییەوە لە شوێنی باوکییەوە بووەتە موفتیی مەدینە. لەو بەڵگەنامەیەدا نامەیەکی جەعفەر بەرزنجی هەیە کە مێژووی ٧ی شەعبانی ساڵی ١٢٩٧ی لەسەر

3 MB.İ.00016.00113.001

نووسراوە و تێیدا ئاماژەی بەوە کردووە کە پێش هەژدەساڵ، واتە ساڵی ١٢٧٩ی کۆچی سەرپەرشتی فەرمانگەی موفتییاتی شافیعییەکانی مەدینە و ئەندامی ئەنجوومەنەکە بووە و لەو ساوە خزمەت دەکات و ساڵی پار فەرماندراوە کە دابمەزرێن، بەڵام گرفتێک لە دامەزراندنەکە هەیە و داوا دەکات کە دەستوبرد بکرێ و کارەکەی بۆ ڕایی بکرێت. نامەکە زۆر بە شێوازێکی جوان و سەرنجڕاکێش نووسراوە و لە کۆتاییدا خۆی بە بەرزنجیزادە جەعفەر؛ موفتی شافیعییەکانی مەدینە ناساندووە.[٤]

## جەعفەر بەرزنجی و گوزەرانخراپی:

وەک لە بەڵگەنامەکاندا دەردەکەوێت، ئەندامانی خێزانەکەی ژمارەیان زۆر بووە و نزیکەی بیست کەس بوونە و بەوهۆیەوە لە حاڵێکی گوزەرانخراپیدا بووە، بەتایبەتی لەوکاتەی کە بووەتە موفتیی مەدینە. بۆیە لە بەڵگەنامەیەکدا کە مێژووی ١٧ی رەبیعی دووەمی ساڵی ١٢٩٧ی کۆچی (بەرامبەر ١٨٨٠/٣/٢٩ز) لەسەر نووسراوە، فەرمان دەرچووە کە لەبەر ناچاری و نەبوونی، مانگانە دوو ئەردەب[٥] گەنم و پازدە قیە سادە و بیست قیە برنج و سێ قیە قاوە و شەکر و سابوون بۆ بەرزنجیزادە سەید جەعفەر ئەفەندی موفتیی شافیعییەکانی مەدینە تەرخان بکرێت[٦].

## جەعفەر بەرزنجی و نامە بۆ سوڵتانی عوسمانی:

لە نامەیەکدا بۆ سوڵتانی عوسمانی، کە مێژووی ٥ی رەبیعی دووەمی ساڵی ١٢٩٧ی لەسەر نووسراوە، ناوی سوڵتانی ئاوا هێناوە: (شوکتلو مهابتلو قدرتلو سلطان الامم، ظل الله فی العالم، محی آثار الدین، مؤید شریعة سید الکونین سلطان نصرت مآب پادشاهمز افندمز ولی نعمت عالم..) لەم نامەیەدا ئاماژەی بەوە داوە کە دوعاگۆتان پێش نۆزدە ساڵ (واتە لە ساڵی ١٢٧٨/ ساڵی ١٨٦١ز) لە خزمەتی فتوای شەریف و حەرەمی حەزرەتی پێغەمبەردا دەرس دەداتەوە و هەموو کاتەکەی بۆ دەرسدانەوە و مەصالیحی خەڵک تەرخان کردووە. دوای تەواوبوونی هەر دەرسێکیش دوعای تەمەندرێژیی بۆ

---

4 ŞD.00285.00033.004

٥ یەک ئەردەب ٢٤ صاعە و هەر صاعێکیش سێ کیلۆگرامە. (بڕوانە فەرهەنگی دهخدا)

6 ŞD.00285.00033.006




پادشا و تەختی سەڵتەنەت دەکات و شەرەفمەند بووە بە لوتفی شاهەنشاهی بە تەرخانکردنی ٧٥٠ قڕووش مووچە، جگە لەمە هیچ یارمەتییەکی نییە و تووشی نەبوونیش هاتووە و خانەوادەکەی زیاتر لە بیست کەسن و لەوەتەی بووەتە موفتیش ماڵەکەی خاڵییە لە میوان لەبەرئەوەی بەو مووچەیە ناتوانێت بگوزەرێنێ، ئەگەرچی ئەو لە سولالەی طاهیرەی حەزرەتی پێغەمبەر و لە بنەماڵەی زانایانە، ئەگەر مانگانە دوو ئەردەب گەنم و پانزە قیە سادە و بیست قیە برنج و سێ قیە شەکر و قاوە و سابوونی پێ کەرەم بکرێت، ئەوا شەرەفمەند دەبێ(٧).



ŞD.00285.00033.007

**مووچەی جەعفەر ئەفەندی:**

لە بەڵگەنامەیەکدا کە مێژووی ١٣٠٤/٤/١٢ک ١٨٨٧/١/٨ز لەسەر نووسراوە، ئاماژە بە تەرخانکردنی بڕە مووچەیەک بۆ ناوبراو دراوە و ئەو بە زاتێکی ڕێزلێگیراو و شایستە ناونراوە و لە ئەمارەتی جەلیلەی مەککەی موکەڕەمەدا مانگانە ٦٣١ قڕووش و دوو پارەی بۆ تەرخان کرابوو.

هەر لەناو دۆسیەکەدا بەڵگەنامەیەکی دیکەی شوورای دەوڵەت هەیە، کە ئاماژەی بەوە داوە سەید جەعفەر ئەفەندی موفتیی شافیعییەکانی مەدینەی مونەوەرە بڕە پارەیەکی بۆ تەرخان کرابوو کە لە ١٠ی ڕەبیعی دووەمی ساڵی ١٢٩٨ەوە بڕیاری لەسەر درابوو، ئەمەش لەگەڵ بڕیاری موجاویرەکانی مەککە و مەدینەدا بوو و بڕیاری داشکاندنی پێنجیەک و دەیەک بۆ هەموو مووچەخۆرەکان هاتبوو و بۆ سەید جەعفەر ئەفەندی کە یەکێکە لە سادات و زانایان و شایانی ڕێزگرتنێکی

7 ŞD.00285.00033.007

زۆرە، تائێستا هیچی بۆ نەکراوە و وا پێویست دەکات مانگانە بڕی ٦٣١ قڕووش و دوو پارەی لە ئەمارەتی مەککەدا بدرێتێ.

لە بەڵگەنامەیەکی تردا کە مێژووی ١٢٩٠/١٠/١١ی کۆچی لەسەر نووسراوە، نووسراو بۆ وەزراەتی دارایی کراوە، کە جەعفەر ئەفەندی موفتیی شافیعییەکانی مەدینەی مونەوەرە و لە سەییدەکانی بەرزنجە، لەبەر پێویستی و گوزەرانخراپی بڕیاردراوە کە مووچەکەی لە ٤٣٨ قڕووشی مانگانەوە، بە زیادبوونی ٣١٢ قڕووش، ببێتە ٧٥٠ قڕووش و مووچەکەی وەک مووچەی موفتی حەنەفییەکان لێ بێت.[٨]

## منداڵەکانی:

لەنێو بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا لە دوای مردنی جەعفەر بەرزنجی، باس لە میراتەکەی دەکرێ کە بۆ ژن و کچ و کوڕەکانی تەرخان بکرێت، بێ ئەوەی ناوی هیچکامیان بهێنێت. لە بەڵگەنامەیەکی تردا کە مێژووی ١٣٢٩/١١/٢٦ی کۆچییە، تەنیا باس لە هاشم ئەفەندی کوڕی جەعفەر بەرزنجی کراوە.[٩]

لە بەڵگەنامەیەکی تردا کە مێژووی ١٣١٤/٩/١٤ی کۆچی لەسەر نووسراوە، ئاماژە بەوە دراوە کە شەریفە تەقییە (واپێدەچێ ئەم شەریفە تەقییە خێزانی جەعفەر بەرزنجی بووە) کچی بەرزنجیزادە وەفاتی کردووە و بەوهۆیەوە مووچەکەی دەدرێتە هەریەک لە شەریفە زەینەب و شەریفە عائیشە و سەید محەمەد هاشم ئەفەندیی کوڕی.. خانمی کۆچکردوو لە گەنجینەی دەوڵەت لە مەدینەی مونەوەرەدا مانگانە ٤١٦ قڕووش مووچەی هەبوو، بەهۆی ئەوەی لە ساداتی کیرام بوون. وادیارە لە ڕۆژی مردنەکەیەوە مووچەکەی هەژماردەکرێت کە ببێتە میرات لەلایەک بۆ سەید محەمەد هاشم ئەفەندی و لەلایەکی تر بۆ شەریفە زەینەب و شەریفە عائیشە بەشێوەیەکی یەکسان تەرخان بکرێت.[١٠]

لەمەوە دەرکەوت کە جەعفەر بەرزنجی دوو کچ و کوڕێکی هەبووە.

8 A.}MKT.MHM.00469.00047.002

9 DH.MTV.00038.00034.001

10 ŞD.00369.00030.001


OSMANLI ARŞİVİ
ŞD
369 | 30

ŞD.00369.00030.001

## جەعفەر ئەفەندی و نائیبی سیواس

بەگوێرەی بەڵگەنامەیەک سەید جەعفەر ئەفەندی عەرزوحاڵێکی پێشکەشی شاهانە کردبوو و بەوهۆیەوە لە مەدینەی مونەوەرەدا خانوویێکی بۆ کڕدرا و بڕێک مووچەیشی بۆ تەرخان کرا. بەڵگەنامەکە مێژووی ١٣١٠/٢/٢٣ی لەسەر نووسراوە و کە ناوی سەید جەعفەر بەرزنجی بە نائیبی پێشووتری سیواس ناوی هاتووە.(١١)

ئەم داوایەی جەعفەر بەرزنجی لە ٤ی رەبیعی دووەمی ساڵی ١٣١٠ بووە و هەروەک لە عەرزوحاڵەکەدا هاتووە کە: دوعاگۆتان لەلایەن پادشاوە حەفتسەد و چەند قڕووشێکی بۆ تەرخان کرابوو، جا لە مەدینەی مونەوەرەشدا هیچ خانوویێکی دەستنەکەوتووە، لەبەرئەوە خۆری لوتف و هاوکاریی پادشا هەموو لایەکی گرتۆتەوە و بەوهۆیەوە چاوەڕێی لوتفی ئەوە، لەبەرئەوەی منداڵی زۆرن پێویستی بە خانوویێک هەیە لە مەدینە و بۆ خەرجییەکەیشی پێویستی بە ١٥٠٠ تا ٢٠٠٠ لیرە هەیە، جا لەبەرئەوەی حاجی بەهرام ئاغا لە باب الحمیدییەی مەدینە بووە و خۆی خەڵکی ئەستەنبوڵ بووە و وەفاتی کردووە و خانووەکەی بە هەزار لیرە دەفرۆشێ و ئەگەر خانووی ئەو بەکرێش بگیرێت ساڵانە ٣٠٠٠ قڕووشی تێدەچێ.. بۆیە داوا دەکات بە هەر جۆرێک بێ خانوویێکی لە مەدینە بۆ دابین بکرێ(١٢).

---

11 BEO.000071.005278.001

12 BEO.000071.005278.002

**بەرهەمەکانی:**

جەعفەر بەرزنجی خۆی لە نامەیەکی بۆ سوڵتانی عوسمانی، کە داوای هاوکاریی کردووە، دوای ئەوەی باس لەوە دەکات کە سی ساڵ لەمەوبەر موفتیاتی شافیعییەکانی کردووە و زۆر بەباشی خەریکی دەرسدانەوە و بڵاوکردنەوەی زانست وبووە، هەروەها باس لە بەرهەمەکانی خۆی دەکات، بەم شێوەیە ناویان دەهێنێ:

لە زانستی فەرموودەدا ئەم کتێبانەی هەن:

کوکب الانوار، تاج الابتهاج، مصابیح الغرر، شواهد الغفران، خلاصة المقصد، بلاغة المرام.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
98 | 7318 | 4

BEO.000098.007318.004

**لە زانستی مێژووشدا ئەم بەرهەمانەی هەیە:**

نزهة الناظرین، نوافح الروض الاعطر، الهدایة[١٣].

لە بەڵگەنامەیەکی تردا کە مێژووی ١٢٨٤/٣/٢٨ی کۆچی لەسەرە، ئاماژە بەوە کراوە کە فەزیلەتلو جەعفەر ئەفەندی موفتیی مەدینەی مونەوەرە و ساداتی عەلەوییەی حوسێنییە، کتێبی (شواهد الغفران علی جلی الاحزان) و (عقد الجوهر فی مولد النبی الازهر) ناوی دوو لەو کتێبانەن کە ناوبراو شەرحی کردوون و هێشتا چاپ نەکراون، بۆیە داوا دەکات کە لەپای ئەوە؛ لوتفی لە بەرامبەر بکرێت[١٤]. بەداخەوە بەشێک لەو کتێبانەی ئێستا ونن.

مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیسیش ناوی سێ بەرهەمی ناوبراوی هێناوە:

---

13 BEO.000071.005278.004

14 MVL.00881.00029.001

تاج الابتهاج على النور الوهاج فى الاسراء والمعراج، الكوكب الانور على عقد الجوهر فى مولد النبى الازهر، نزهة الناظرين فى مسجد سيد الاولين والآخرين.

بەگوێرەی بەدواداچوونی ئێمە، لە سەردەمی عوسمانیدا دوو کتێبی ناوبراو چاپ کراون و ئەم کتێبانە لە کتێبخانەکانی تورکیادا نوسخەیان هەیە، کە بریتین لە:

١-تاج الابتهاج على النور الوهاج فى الاسراء والمعراج

ناوی نووسەر: جعفر بن السيد اسماعيل المدنى البرزنجى

چاپخانە: المطبعة الحميدية، شوێنی چاپ: قاهیرە

ساڵی چاپ: ١٣١٤ ک. لاپەڕە: ١٨٦

ئەم کتێبە لە کتیبخانەی ئیسام بە ژمارە (١٥٣١٥٥) پارێزراوە.

٢- نزهة الناظرين في مسجد سيد الأولين والآخرين

ژمارەی لاپەڕە: ٢٢١، چاپخانە: المطبعة الجمالية. شوێنی چاپ: قاهیرە/ میصر

ساڵی چاپ: ١٣٣٢ک/ ١٩١٤ز. چاپی یەکەمی ئەم کتێبە لە چاپخانەی الاميرية بووە لە ساڵی ١٣٠٣ی کۆچی و ١١٩ لاپەڕە بووە.

لەسەر بەرگی کتێبەکە وەها نووسەر ناسێنراوە: العالم الفاضل الجليل والحبر الكامل النبيل فخر السادة الحسينية الكرام، ومفتى الشافعية بمدينة سيد الانام، الراجى عفو ربه المعين المنجى السيد جعفر بن السيد اسماعيل المدنى البرزنجى. ئەم کتێبە لە کتێبخانەی ئیسام بە ژمارە (١٥٢٣٨٩) پارێزراوە.

## وەفاتی:

بەگوێرەی بەڵگەنامەیەک کە باس لە بەشە میراتی منداڵەکانی جەعفەر ئەفەندی دەکات، ئاماژە بەوە دراوە کە ناوبراو لە یەکی مانگی ئابی ١٣١٥ی ڕۆمی کۆچی دوایی کردووە. کە دەکاتە بەرامبەر ١٣/٨/ ١٨٩٩ی زایینی. وادیارە هەر لە مەدینەیش وەفاتی کردووە.

## سەرچاوەکان


کتێب:

- عبدالكريم محمد المدرس، علماؤنا فی خدمة العلم والدين، عنی بنشره محمد علی القرداغی، الطبعة الاولی، بغداد، ١٩٨٣. ص١٣٦.

- خيرالدين الزركلی، الأعلام، قاموس تراجم لأشهر الرجال والنساء من العرب والمستغربين والمستشرقين، ج٢، دار العلم للملايين، بيروت، ط١٥، ٢٠٠٢، ص١٢٢.

کۆدی بەڵگەنامەکان:

MB.İ.00016.00113.001

ŞD.00285.00033.004

ŞD.00285.00033.006

ŞD.00285.00033.007

A.}MKT.MHM.00469.00047.002

DH.MTV.00038.00034.001

ŞD.00369.00030.001

BEO.000071.005278.001

BEO.000071.005278.002

BEO.000071.005278.004

MVL.00881.00029.001